18

زنجیرەی گەنجانی ئیسلامی

# -العبادة-

## پوختەیەك دەربارەی پەرستن

نوسینی : باوکی ئوسامە

تویشوو
کتێبخانەی تویشوو

# بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

إنَّ الحمدَللَّه، نحمدُه ونستعينُه، ونستغفرُه، ونتوبُ إليه، ونعوذُ به من شرورِ أنفسِنا؛ ومن سيِّئاتِ أعمالِنا، من يهدِه اللَّه فلا مُضِلَّ له، ومن يضلل فلا هاديَ له. وأشهد أنْ لا إلهَ إلا اللَّه وحدَه لا شريكَ له، وأشهدُ أن محمداً عبدُه ورسولُه، صلَّى اللَّه عليه، وعلى آلهِ وصحبِهِ، وسلَّمَ تسليماً كثيراً إلى يومِ الدين.

وبعد ـــ:

خوێنەرانی بەڕێز بە پشتیوانی خوای پەروەردگار لەم نامیلکە بچوکە دا باسی پوختەیەك دەربارەی پەرستن (العبادة) دەکەین هیوادارین ببێتە جێگەی ڕەزامەندی خوای پەروەدگارو ئەم کارەمان لێ قبوڵ بکات، و ئێوەی بەڕێزیش سوودی لێ ببینن.

## (العباده) واتای پەرستن

وشـەی پەرسـتن (العبـادة) لە بـە واتای پابەنـد بـون و ملكـەچ كردن وگوێ ڕايەڵی كردن دێت.
ئیبن تەیمیەش ڕەحمەتی خوای لێ بێت لە پێناسەیدا دەلێ (العبـادة هي اسم جامع لكل ما يحبـه الله ويرضـاه مـن الأقـوال و العمال الباطنيـة و الظاهره ) واتە: پەرسـتن: ناوێكی گشـتگرە بۆ هـەموو ئەوانـەی خـوا خۆشی دەوێن و پێیان ڕازییە لە وتەو كردەوە پەنهان و ئاشكراكان.
هەروەها دەربارەی ناوەڕۆكی پەرستنیش دەڵێ:
(العبادة الامور بها تتضمن معنى الذل ومعنى الحب فهى تتضـمن غاية الذل لله تعـالى , بغايـة المحبـة له ) واتـە: ئـەو پەرسـتنەی كـە فـەرمانی پێكراوە واتای ملكەچی و واتای خۆشەویستی دەگرێتەوە , واتـە ئـەو پـەری ملكـەچی بـۆ خـوای گـەورە و ئـەو پـەری خۆشەویسـتنی دەگرێتەوە.

## مەبەست لە دروست کردنی مرۆڤ:

(وَمَـا خَلَقْـتُ الْجِـنَّ وَالْإِنـسَ إِلَّا لِيَعْبُـدُونِ) [الذاريات : ٥٦] واتـە: جنوکـە و مـرۆڤم بـۆ هـیچ مەبەسـت و ئـەنجامێک دروسـت نـەکردوە تەنها پەرستن نەبێت.

هەروەها مەبەست لە ڕەوانە کرانی پێغەمبـەرانیش سـەلامی خـوایان لـێ بێت تەنها بـۆ ڕون کردنـەوە و گـەیاندنی پـەیامی پـەرستنی خـوا بـوە بـە تاک و تـەنهایي , وەک خـوای گـەورە دەفـەرموێت: (وَمَـا أَرْسَـلْنَا مِـن قَبْلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِي إِلَيْهِ أَنَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنَا فَاعْبُدُونِ) [الأنبياء : ٢٥] واتە: ئەی محمد ﷺ لە پێش تۆوە هەر پێغەمبەرێکمان ڕەوانـە کردبێـت, نیگامان بۆ کردوە تاکو بە خـەڵکی ڕابگـەیـەنێت کـە هـیچ پـەرستراوێک نییە شیاوی پەرستن بێت بێجگە لە من دە بمپەرستن.

هەروەها فەرموودەکەی پەیامبەر ﷺ (حق الله على العباد ان يعبدوه ولا يشركـوا بـه شـيئا). {متفق عليـه/صحيح البخارى رقم:(٢٨٥٦) و صحيح مسلم رقم:(٣٠)

وە الله تعـالێ پەیامـبەرانی ناردوە بـۆ ئەوەی بانـگەوازی بـکەن بـۆ پەرستنی و شیرک و هاوەڵبڕیاردانی لێ دووربخەنەوە،

خوای گەورە دەفەرموێت: (ولقد بعثنا في كل أمة رسولا أن اعبدوا الله واجتنبوا الطاغوت)(سورة النحل ٣٦)

واتە: بەدڵنیایي لەهەموو ئوممەتێک واتە کۆمەڵە مرۆڤیکدا پەیامبەرێکمان ناردوە بۆ ئەوەی پێیان بڵێ بە تاک و تەنها خوای گەورە بپەرستن و خۆتان دووربخەنەوە لە تاغوت (پەرستنی جگە لەخوا)

واتە:ماف و حەقی خوا لەسەر بەندەکانی بریتییە لەوەی کە بیپەرستن و هیچ هاوەڵ و شەریکی بۆ بریار نەدەن.

واتە لەگەڵ خوا نەڵێی یا شیخ عبدالقادری گەیلانی یان نازانم فلان ئەمانە هەموی بەندەی خوا و جگە لەخوا هاوار بکەیتە شەخسیک ئەوا شەریکت بریار داوە بۆ خوا وە تەنانەت نابێت هاواربکەیت پەیامبەر ﷺ چونکە شرکە وە پەیامبەری خوا ﷺ خۆی ئەمەی فێکردوین.

## چۆنیەتی خواپەرستی:

خوا دەپەرستین بەو شێوازەی کە خواو پەیامبەرەکەی ﷺ فەرمانیان پێ کردوین، خوای گەورە دەفەرموێت: (یا أیها الذین آمنوا أطیعوا الله وأطیعوا الرسول ولا تبطلوا أعمالکم) ٣٣ محمد)

واتە: ئەی ئەو کەسانەی ئیمان و باوەڕتان هێناوە گوێڕایەڵی فەرمانی خواو فەرمانی پەیامبەرەکەی بن، کاروکردەوە و چاکەکانتان پووچەڵ مەکەنەوە..

وە پەیامبەر ﷺ فەرموویەتی: (من عمل عملا لیس علیه امرنا فهو رد) صحیح مسلم رقم(١٧١٨)

واتە: هەر کەسێک هەر کردەوەیەک ئەنجامبدات کەفەرمانی ئیمەی لەسەر نەبێت ئەوا ئەو کردەوەیە ڕەتدەکرێتەوە و وەرناگیرێت.

## مەرجەکانی خواپەرستی:

ئایا مەرجەکانی وەرگرتن و قبوڵکردنی کردەوە بریتین لەچی؟
وەڵام/مەرجەکانی وەرگرتن و قبوڵکردنی کردەوە لەلای خوا سێ مەرجن:
١- (الإيمان الصحيح والتوحيد) ئیمانێکی دروست و بەتەنها یەک خوا پەرستی:
خوای گەورە دەفەرموویێت: (إن الذين آمنوا وعملوا الصالحات كانت لهم جنات الفردوس نزلا) ١٠٧ الكهف)
واتە: بەڕاستی ئەوانەی کە ئیمان و باوەڕیان هێناوەو کردەوە چاکەکانیان ئەنجامداوە،چەندین باخیان بۆ هەیە لە فیردەوسدا و میوانداری دەکرێن
وە پەیامبەری خوا ﷺ دەفەرموویێت: (قل آمنت بالله، ثم استقم) صحيح مسلم برقم(٣٨)
واتە: بڵێ باوەڕم هێناوە بەخوا و ئینجا بەردەوامیش بە لەسەری..

٢- (الاخلاص) نیبەت پاکی: کە بریتییە لە ئەنجامدانی کردەوە بۆ خوا بەتەنها بەبێ (ریاء) پێش چاوی و بەبێ گوێدانە خەڵک و(سمعە)ناوبانگ دەکردن.
خوای گەورە دەفەرموویت: (فاعبد الله مخلصا له الدين) ٢ الزمر)
واتە: خوا بپەرستە و بەنیبەت پاکی یەوە دینداری بۆ ئەنجام بدە.

٣- (الاتباع وموافقة الشريعة) بەپێی ئەو شەرعە بێت کە پەیامبەری خوا ﷺ پێی هاتووە:
خوای گەورە دەفەرموویت: (وما آتاكم الرسول فخذوه وما نهاكم عنه فانتهوا واتقوا الله إن الله شديد العقاب) ٧ الحشر)
واتە: ئەوەی کە پەیامبەر ﷺ بۆی هێناون لێی وەرگرن و ئەوەشی کە قەدەغەی کردووە لێتان وازی لێبێنن و خۆ پارێزی بکەن لە تاوان و سزای خوا و لێی بترسن چونکە سزای خوا زۆر توندە.
پەیامبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (من أحدث في أمرنا هذا ما ليس منه فهو رد) رواه البخاري (٢٦٩٧)، ومسلم (٤٤٦٧)، وأبو داود (٤٦٠٦)، وابن ماجه (١٤).
واتە: هەر کەسێک شتێک بیروباوەڕێک یان کردەوەیەک لەم دینەی ئێمەدا داهێنێت کەفەرمانی ئێمەی لەسەر نەبێت ئەوا ئەو شتە ڕەتدەکرێتەوە

(رد:غير مقبول،واته: وەرناگیرێت)
(زانایان لەبارەی ئەم حەدیثە فەرموویانە: ئەم فەرموودەیە یەکێکە لە بنچینە گەورەکانی ئیسلام، فەرمودەیەکی کورتە و مانایەکی زۆری هەیە، بە ئاشکرا بەرپەرچی هەموو بیدعە و داهێنراوەکان ئەداتەوە، پێویستە لەبەربکرێت، بەرپەرچی هەموو بەتاڵەکانی پێبدرێتەوە. بکرێت بە بەڵگە بۆ بەرپەرچ دانەوەی بیدعەکان.
ئەمەش هەموو بوارەکانی عیبادەت و حوکم کرد دەگرێتەوە.
لە قورئان و سوننەتەکانی پێغەمبەردا ﷺ هەموو شتێك ئاشکراو روون کراوەتەوە, هیچ شتێکیان بە نهێنی و شاراوەیی نەهێشتۆتەوە, بە دوور و درێژی باسی بەندایەتی کراوە, ئەوەندە بەجوانی فەرمان و ئەحکامەکانیان بۆ بەیان کردووین, شەوی تاریکیان وەك رۆژی رووناك بۆ لێکردووین, بۆیە پێویستە بە توندی دەستبگرین بە سوننەتەکانی سەروەر و خەلیفە راشیدینەکانەوە وەك لەم فەرمودە دەردەکەوێ قال رسول الله ﷺ (قَالَ: أُوصِيكُمْ بِتَقْوَى اللَّهِ، وَالسَّمْعِ وَالطَّاعَةِ وَإِنْ تَأَمَّرَ عَلَيْكُمْ عَبْدٌ، فَإِنَّهُ مَنْ يَعِشْ مِنْكُمْ فَسَيَرَى اخْتِلَافًا كَثِيرًا، فَعَلَيْكُمْ بِسُنَّتِي وَسُنَّةِ الْخُلَفَاءِ الرَّاشِدِينَ الْمَهْدِيِّينَ، عَضُّوا عَلَيْهَا بِالنَّوَاجِذِ)

ئەمانەش هەر هەموویان بەڵگەن لەسەر ئەوەی ئێمە ئیتر لە بواری عیبادەت و حوکم کردندا هیچ پێویستیەکمان بە داهێنان نیە هەرچەندە نیاز و مەبەستیشیان چاك بێت لەو کارەدا, چونکە شەرع دانان کاری ئێمە نیە, شەرع دانەر هەر خوایەو بەس, مافی کەسی تر نیە.

ئەبو هورەیرە رەزای خوای لێ بێ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: (مَا أَمَرْتُكُمْ بِهِ فَخُذوهُ وَمَا نَهَيْتُكُمْ عَنْهُ فَانْتَهُوا). واتا: (ئەوەی فەرمانم پێکردوون وەری بگرن و کاری پێبکەن، وە ئەوەشی لێتانم قەدەغە کردووە لێی بە دوور بگرن)
پابەند بوون بە شەرعەوە لە بواری عیبادەت و حوکم کردندا بنچینەو بنەمایەکی زۆر گرنگ و پڕ بایەخە چونکە قبوڵ بوون و سەلامەتی ئیمانی بەندە.
وە دەبێ بە خۆشەویستی خودا بپەرستین و لە ترسی سزا و بە ئومێدی پاداشتەوە؟
واتە بە ئومێدی ئەوەی کە لە سزای پارێزراوبین و بە چاکەش پاداشتمان بداتەوە،

خوای گەورە لە وەسفی ئیماندار دەفەرموویێت: (یدعون ربهم خوفا وطمعا) ( (١٦) السجدة) واتە: پەروەردگاریان دەپەرستن و لێی دەپارێنەوە لە ترسی سزایی و بەتەماحی پاداشتەوە

وە پەیامبەری خوا صل الله علیه وسلم فەرموویەتی: (اسال الله الجنة، واعوذ به من النار)(صحیح ابی داود برقم(٧٩٣)

واتە: داوای بەهەشت لەخوا دەکەم و پەناشی پێ دەگرم لە ئاگری دۆزەخ.

## پایەکانی عیبادەت (پەرستن):

١: خواپەرستی بە خۆشەویستی (المحبة): پەروردگار فەرموویەت: (قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ ] پێیان بڵێ ئەی پێغەمبەر ﷺ ئەگەر ئێوە خواتان خۆش ئەوێ و « ئەتانەوێ لێی نزیک ببنەوە» دەبێ پەیڕەوی لەشەریعەت وبەرنامەکەی من بکەن، ئەوسا خوایش ئێوەی خۆش دەوێ [وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ] و لە هەڵەو گوناهەکانیشیان خۆش دەبێت.

وە پەروەردگار فەرموویەتی: (أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا] ئەی ئەوکەسانەی باوەڕتان هێناوە! [مَن يَرْتَدَّ مِنكُمْ عَن دِينِهِ] هەرکەسێکتان لەئایینی خۆی، واتە: لەدینی ئیسلام پاشگەز بێتەوەو وەرگەڕێ [فَسَوْفَ يَأْتِي اللَّهُ بِقَوْمٍ] جا خوا لەمەولا کەسانێک دێنێت، ئەوەندە بەرفەرمانی دەبن [يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُ] خۆشی دەوێن و، ئەوانیش ئەویان خۆشدەوێ [أَذِلَّةٍ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ] و لەئاستی خاوەن باوەڕاندا، خۆ بەکەمزان و بەسۆزن [أَعِزَّةٍ عَلَى الْكَافِرِينَ] و بەرامبەر بە کافرو بێ باوەڕان، خۆ بەگەورەزان و سەربڵندو دەروون بەرزن و، توندوتیژو بەهەڵمەتن [يُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ] بۆ ڕەزامەندی خواش تێدەکۆشن و جەنگ دەکەن [وَلَا يَخَافُونَ لَوْمَةَ لَائِمٍ] و لە تەشەرو لۆمەی لۆمەکەرانیش ناترسن و باکیان نابێ.

ئايا بەكارهێنانی وشەی (عشق) بۆ خوای پەروەدگار دروستە؟؟
بەكارهێنانی وشەی (عشق) بۆ خوای پەروەدگار دروست نیە چونكە:
یەكەم: پێشەوا ابن الجوزي - بەڕەحمەت بێت - دەفەرمووێت: العشق عند أهل اللغة لايكون إلا لما ينكح.
واتە: وشەی (عشق) لەلای زانایانی شارەزا بە زمانی عەرەبی بەكار نایەت تەنها بۆ ئەوە نەبێت كە مارە دەكرێت.
دووەم : پێشەوا ابن أبي العز - بەڕەحمەت بێت - دەفەرمووێت: أن العشقَ محبةٌ مع شهوةٍ.
واتە: حەقیقەتی عشق بریتیە لە: خۆشەویستیەک كە ئارەزوو و شەهوەتی لەگەڵ بێت.
سێیەم : قال أبو بلال العسكرى رحمه الله فى الفرق بين العشق والمحبة: وهي شهوة الرجل للنيل مِمَّن يعشقه، ولا تسمى شهوته لشرب الخمر، وأَكل الطِّيب عشقًا.
واتە: عشق بریتیە لە ئەو ئارەزووەی كەسێک هەیە بۆ دەست خشتنی ئەوەی كە دەیەوێت لەو كەسەی كە عاشقی بووە! وە ئارەزوو بۆ خواردنەوەی مەشروب و وە خواردنی شتی خۆش و بەسود ناوترێت عشق .

چـوارەم : پێشـەوا عـزي كـوري عبدالسـلام - بەڕەحمەت بێـت - دەفەرمووێت: (لا يجوز أن يُنسب إلى الله تعالى أنه يعشق ويُعشق)

واتا: دروست نیه کە ئەوە بدرێتە پاڵ پەروەردگار کە (عشـقی هەیە یان عشقمان بۆی هەیە) .

پێنجەم: وقال اللجنة الدائمة فی جواب سؤال وجه لهم : في التسمية بعاشق الله سوء أدب.

واتە: ناونان بە (عاشق الله) کەم ئەدەبی تیایە .

شەشـەم : پێشـەوا صالح الفوزان –خـوا بیپارێزێـت- دەفەرمووێت: (فـلا يقـال: عاشـق الله وإن كان العشـق مـن درجـات المحبـة، لكـن العشق لا يناسب إطلاقه على الله سبحانه وتعالى ) .

واتا: ناوترێت: (عاشـق الله) هەرچەنـدە (عشـق) یەکێکە لە پـلەکانی خۆشەویستی بەڵام (عشق) بەکارهێنانی بۆ خوای پەروەردگار گونجاو نیە.

وشەی (العشـق) لە قورئـان و فەرمـوودەدا نەهـاتووە، بەڵام کەسـانی نەزان بە خوای پەروەردگار بەکاری دێنن لە دەروێش و صوفیەکان.

٢: خواپەرستی بە ترس (الخوف): قال الله عز وجل: (وَلِمَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِ جَنَّتَانِ] وە بۆ هەر کەسێک لە جێگای وەستانی خۆی، لە بەردەم پەروەردگاری خۆی بترسێ دوو بەهەشتی گەورە هەیە.
وقال الله عز وجل: (الَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُم بِالْغَيْبِ] ئەوانەی کە لە پەنامەکیي و پەنهانییدا لەپەروەردگاریان دەترسن، هەر چەندەیش پەروەردگاری خۆیان نەدیتووە [وَهُم مِّنَ السَّاعَةِ مُشْفِقُونَ] لە بەرپابوونی ڕۆژی قیامەتیش هەمیشە لە ترسدان .
وقال الله عز وجل: [ فَلَا تَخَافُوهُمْ وَخَافُونِ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ] جا ئەگەر باوەڕتان بەهێزە، لەوان مەترسن لەخۆم بترسن خوا دەفەرموێ: [أليس الله بكاف عبده ويخوفونك بالذين من دونه] هەتا دەگاتە: [قل حسبي الله عليه يتوكل المتوكلون].

٣: خواپەرستی بە ئومێد (الرجاء): قال الله عز وجل: (قُلْ يَا عِبَادِيَ الَّذِينَ أَسْرَفُوا عَلَىٰ أَنفُسِهِمْ] ئەی پێغەمبەر! ﷺ لە منە-وە بڵێ: ئەی بەندەکانی من! ئەی ئەوانەی ستەم و زیادە ڕۆییتان لە خۆتان کردووە! [لَا تَقْنَطُوا مِن رَّحْمَةِ اللَّهِ] ئێوە لە ڕەحمەت و میهرەبانی خوا بێ ئومێد مەبن، (ئیبن عەباس) دەڵێ: بڕێ لە موشریک و هاوبەشدانەرەکان، خەڵکێکی زۆریان کوشتبوو، زینایان کردبوو، پاشان هاتنە لای پێغەمبەر ﷺ وتیان: ئەو قسەو باسە تۆ دەیڵێی شتێکی زۆر چاکە، ئەی خۆزگە کەفارەتی گوناحەکانمانت پێ دەوتین: ئەوجا ئایەتی [والذين لايدعون مع الله إلها آخر ولايقتلون النفس التي حرم الله إلا بالحق ولا يزنون] ٢٥ /٦٨، وە ئایەتی: [قل ياعبادي الذين أسرفوا على أنفسهم لا تقنطوا من رحمة الله..] ٥٣/٣٩ هات. متفق عليه). [إِنَّ اللَّهَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعًا] بەڕاستیی خوا لە هەموو گوناحێ خۆش دەبێ ئەگەر تاوبەی ڕاست و تەواو لەسەر بکەن.

مـورجیئەکان تەنهـا دەسـتیان بە ڕەجـاء و ئومێـدەوە گـرت بـۆیە کاروکردەوەیان لە ئیمان دەرهێنا، بێ ئاگا لەوەی کە کارو کردەوە مەرجە لە ڕەجا و ئومێدیش. خـودای گەورە فەرمـوویەتی: [فَمَن كَانَ يَرْجُو لِقَاءَ رَبِّهِ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَالِحًا] ئینجا هەرکەسـێک لەئێـوە ئومێدی بەگەیشـتنی دیـداری پەروەردگـاری خـۆی هەبێ لەدوارۆژدا با کاری چاک و کردەوەی دروست ئەنجام بدات.

وە دەبێ هەمیشە بە تـرس و ئومێـدەوە خواپەرسـتی بکەیـن: [وَادْعُوهُ خَوْفًا وَطَمَعًا] و هەمیشە بەترس و بە ئومێدەوە لە خوا داوا بکەن.

## سودەکان

دەروێشەکان و سۆفیەکان خواپەرسـتی تەنها بە خۆشەویسـتی دەکەن و وازیان لە ترس و ئومێد هێناوە و تووشی گومڕایی بوونە.

خەواریجەکان خواپەرسـتی تەنهـا بە تـرس دەکەن و وازیان هێنـاوە لە ئومێد و تووشی گومڕایی بونە.

مورجیئەکان خواپەرستی دەکەن بە ئومێد و وازیان هێناوە لە تـرس و تووشی گومڕایی بونە.

بەڵام کۆمەڵەی ڕزگاربوو و سەرکەوتوو (أهل السنة والجماعة الطائفة الناجيـــة المنصـــورة) خواپەرســـتی دەکەن بە هەمـــوو مەرجەکان و ڕوکنەکانی..

خوای تعالی بمان پارێزێت لە هەڵەو تاوان و شارەزای شەریعەتەکەیمان بکات امین.

اللهم انصر دينك وكتابك وسنة نبيك يارب العالمين واكتب لنا الشهادة في سبيلك بعد طول عمر وحسن عمل إنك ولي ذلك والقادر عليه هذا وصلى اللهم على نبينا محمد وعلى آله وصحبه وسلم




پرۆژەیەکی تەواو سەربەخۆی ئیسلامییە و لە پێناو بەرز ڕاگرتنی شەریعەت و بەرنامەی خوای گەورە دژی هەموو ڕێچکە خوارو فیکرە سەر لێشێواوەکان دەوەستێتەوە.
کتێبخانەی تویشوو بە بەڵگەی قورئان و سوننەت بانگەوازی خوایی دەکات.

 KTIBXANY_TWESHU  